# پشیلەو تووتی

و. لەعەرەبییەوە: ڤیان شێرکۆ
نیگار: دڵشاد عەلی



















نرخی (٣٠٠) دینار



# ئەحمەد سەلامی

# چیرۆکنووس و شاعیر

ئا: زانیار سەردار قرگەیی- سلێمانی

* ئەحمەد سەلام یەکێکە لەچیرۆکنووس و شاعیرە دیارەکانی کوردستان، کە چیرۆکی منداڵانی نووسیوەو وەریگێڕاوە.
* لەساڵی ١٩٤١ لەگەڕەکی (زەرگەتە)ی شاری سلێمانی لەدایک بووەو لەساڵی ١٩٦٤- ١٩٦٥ کۆلیژی ئاداب/ بەشی کوردی لەزانکۆی بەغدا تەواوکردووە.
* لەنێوان ساڵانی ١٩٦٧-١٩٩٠ لەشاری سلێمانی مامۆستاو بەڕێوەبەری قوتابخانە ناوەندییەکان بووە.
* لەناوەڕاستی ساڵانی شەستەکاندا دەستی داوەتە نووسین و بابەتی لە زۆربەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوکردووەتەوە.
* لەناوەڕاستی ساڵانی نەوەتەکانەوە تا ئێستا چەندین چیرۆکی منداڵانی لە گۆڤاری (هەنگ)دا بڵاو کردووەتەوە.
* کۆمەڵە شیعرێکی بەناوی(ڕستێ شیعری ئاگراوی)و کۆمەڵە چیرۆکێکی کورتی بەناوی (ڕۆژگارە خەماوییەکان) بڵاوکردووەتەوە، کۆمەڵە چیرۆکێکی منداڵانیشی ئامادەیە بۆ چاپ بەناوی (ڕازی منداڵان).
* ئەمەش نموونەیەکە لەشیعرەکانی مامۆستا ئەحمەد سەلام کە تایبەتە بە منداڵ:

## زمانی گوڵ

ئەی منداڵانی گەڕەک | نەکەن یاری کەن بەچەک
ڕێی ئاشتی بگرنە بەر | دووربن لەئاگری شەڕ
ئاشتی پەیامی خوایە | شەڕ وێرانیی لەدوایە
ئێوە ئەگەر دڵسۆزبن | (ئەبێ دڵسۆزی هۆزبن)
هۆزی ئێمە بەئاشتی | زۆرمان دەگاتە دەستی
زمانی گوڵ پەیڕەوکەن | نەفرەت لە(شەڕە کەو) کەن

گۆڤارێکی مانگانەی منداڵانە
وەزارەتی رۆشنبیریی هەرێمی کوردستان
دەریدەکات



# بەرەو پۆلی یەکەم

لە باخچەو گوڵزارەوە
لەخەندەی بەهارەوە
وەکو گزنگی بەیان
ئارام و نەرم و نیان
دەچم بۆ پۆلی یەکەم
درێژە بەخوێندن دەدەم
بەئاواتی دڵ و گیان
دەبم بەجوانترین پەیام
بۆ سەراپا کوردستان
خونچە گوڵی ناوباخچەم
خۆری کوردی یەکپارچەم




هۆنراوەی: عوسمان محەمەد هەورامی
نیگار: هەژار سەلاح

ژمارە ١١١
تشرینی یەکەم ٢٠٠٥



خاوەنی ئیمتیاز
سامی شۆڕش
وەزیری رۆشنبیری

سەرنووسەر
حەمەساڵح فەرهادی

بەڕێوەبەری نووسین
گولەر حەبیب سیامەنسووری

بەڕێوەبەری هونەری
عەبدولقادر عەلی مەردان

فەرزی رەنگەکان
ئاسۆ خالید

پیت چنین
میدیا خالید

HENG

A children Monthly Magazine
Issued by
The Ministry of Culture - Kurdistan Region

ناونیشان: کوردستان - هەولێر - شەقامی هەڵەبجە/ باڵەخانەی (کۆشکی هونەر) نهۆمی یەکەم
ت/ بەداڵە ٢٢٣٤٨٨٨ - مۆبایل ٤٤٩٥٦٠٨

بەرگی یەکەم: پەخشان گەلالی
بەرگی دووەم: دلشاد عەلی

گۆڤاری هەنگ لەسەر سایتی
www.w-roshnbiri.org
بخوێنەوە

چاپ:
بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی رۆشنبیری - هەولێر



# دۆستایەتی

نووسینی: محەمەد کەریم نانەوا
نیگار: دارا محەمەد عەلی



کاتی نیوەڕۆ دنیا گەرم بوو برکی دەکرد، (ئالان)ی بچکۆلە لەگەڵ باوکی بەسواری ئۆتۆمبیل لەبازاڕەوە بەرەو ماڵ دەگەڕانەوە، لەناکاو دیتی مامۆستا هەردی، مامۆستای قوتابخانەکەیان لەسەر شۆستە ڕاوەستاوەو، چاوەڕوانی (پاس) دەکات.

ئاڵان بە باوکی گوت: بابە زەحمەت نەبێ ڕایگرە.

باوکی ئۆتۆمبیلەکەی لەلاتەریکی شەقام ڕاگرت، لێی پرسی: چییە کچم خێرە؟!

ئالان گوتی: بەڵێ بابە خۆشیت.



پاشان دابەزی، چووە بەردەمی مامۆستا هەردی، دوای سڵاوو ڕێز، پێی گوت: فەرموو مامۆستا، کەرەم کە با بتگەیەنینەوە بۆ ماڵ.

مامۆستا سوار بوو، ئینجا لەگەڵ باوکی پێکی ناساندن، پاشان بەڕێگاوە مامۆستا باسی زیرەکی و لێهاتوویی و ژیریی ئالانی کرد، بەمە خۆشحاڵ بوو کەتوانیویەتی پەروەردەی نەوەیەکی ئەمەکداری وەکو ئالان بکات.

دواجار باوکی ئالان سوپاسی باوکی هەردی و ئالانی کردو گوتی:





گەشبینم بەدۆستایەتیی
نێوان مامۆستاو قوتابی،
چونکە دڵنیام کە ئەم
دۆستایەتییە دەبێتە بەردی
بنچینەی بەختەوەریی
گەلێکی شارستانییەتخوازو
نیشتمانێکی ئازادو
سەربەخۆ.





# خۆگرتن بەعارەبانە

نووسینی: شاخەوان عەلی حەمەد
نیگار: سالح مەهدی



قوتابخانەکە تەواو دوور بوو کاتێک شێرکۆو کاوەو نەهرۆ گەیشتنە ڕۆخی شەقامە سەرەکییەکە، تراکتۆرێک بە بەردەمیاندا تێپەڕی،شێرکۆ بەپێکەنینەوە گوتی: دەی بکەونە خۆتان، خاوەن تراکتۆرەکە ئاگای لێمان نییە، بابۆخۆمان لەدواوە خۆ بەعارەبانەکەیەوە بگرین، بەمە هیچ نەبێ لەقوتابخانەکەمان نزیک دەبینەوە.

نەهرۆ پێی باش بوو، گوتی: قسەکەت ڕاستە، خۆ گەر لەقوتابخانەشمان نزیک نەکاتەوە، ئەوە هەر خۆگرتن بەعارەبانە خۆشە.

بەڕاکردن کەوتنە دوای تراکتۆرەکەو خۆیان بەعارەبانەکەوە گرت، بەڵام کاوە چۆن دەڕۆیشت ڕۆیشتنی خۆی تێک نەدا، بەڵکو بەو دیمەنەی لەوانی بینی ناوچەوانی گرژ کرد و سەری هەڵبڕی و تەماشای کردن.

شوفێرەکە لەنیوەی ڕێ ئاوڕی لێدانەوە، بەدەم دەست هەڵشەقاندن و هەڕەشەکردنەوە تراکتۆرەکەی هێواش کردەوە. بەمە شێرکۆو نەهرۆ لەترسان خۆیان فڕێدا، شێرکۆ ئازاری پێ نەگەیشت، بەڵام نەهرۆ بەگوێرەی شەلینەکەی لەوە دەچوو ئازاری پێگەیشتبێ، بەڕاکە ڕاک گەڕانەوە لای کاوە، شێرکۆ بەرقەوە کەوتە جنێودان بەشوفێرەکە!

کاوە ڕووی تێکرن و بەدەم ئاخ هەڵکێشانەوە گوتی: هاوڕێیان ، جنێودان بۆ مرۆڤ عەیبە، گوناهی ئەو شوفێرە چییە تۆ بێ پرسی ئەو خۆت بە عارەبانەکەیەوە بگریت؟ باشە گەر لەو کاتەی خۆتان فڕێدا، دەستێکتان یان قاچێکتان یان سەرتان بشکایە و نەتانتوانیبوایە هەڵبستنەوەو لەوکاتەدا ئۆتۆمبیلێکی دیکە خێراتر بهاتایەو بەسەرتان بکەوتایە، چیتان لێ دەهات ؟!

شێرکۆ و نەهرۆ کەمێک دامان، ئەوجا بەپەرۆشەوە گوتیان: زۆر شوکر ئەمجارە هیچمان لێ نەهات. پەشیمانین، بەڵێن بێ لەمەو دوا نابێ شتێک بکەین کە مەترسیی لەسەر ژیانماندا هەبێت.





# لێفەکەی داپیرە

نووسینی:
پەخشان حەمە میرزا حەمە شەفیق
نیگار: دلشاد عەلی

ژیار زۆری حەز لە چیرۆکەکانی داپیرەی دەکرد، هەر شەوێک داپیرەی سەردانی بکردنایەو چیرۆکی بۆ بگێڕایەتەوە، ئەوشەوە خەوی خۆشی دەبینی و بەیانیش زوو بەئاگا دەهات، چونکە شەو باش خەوی لێدەکەوت، بەڵام کە داپیرەی دەڕۆیشتەوە، نەیدەزانی چۆن ئیتر گوێبیستی چیرۆکەکانی داپیرەی بێت.




ڕۆژێکیان ژیار چوو بۆ سەردانی داپیرەی و چەپکێک گوڵی جوانیشی بەدیاری بۆ برد و لێی پرسی کە چی بکات بۆ ئەوەی بتوانێت بەباشی بخەوێت.

داپیرەش دەستی بەسەر سەریدا هێناو لێفەیەکی ڕەنگاوڕەنگی بەدیاری پێبەخشی و گوتی: بەم لێفەیە بخەوەو بیر لەچیرۆکەکانی داپیرەت بکەوە.

لەو ڕۆژەوە ژیار بەلێفەکەی داپیرەی دەخەوێت، هەموو شەوێک خەوی خۆش دەبینێ و بەیانییانیش زوو لەخەو هەڵدەستێ.

# گوندەکەم

هۆنراوەی: شێوان غەمبار
نیگار: ساوێن دارا

چەندە جوانە گوندەکەم
گوندە خنجیلانەکەم
ئەو لوتکەو شاخ و چیایە
بۆمان پشت و پەنایە
ئەم کارێزو کانییە
کانگای کامەرانییە
خۆ ئەم ڕەزو دێبەرە
هەمووی زێڕو گەوهەرە







# بەشداری و خۆپەرستی

ئا: سابیر مەعرووف
نیگار: هەژار سەلاح

لەشەوێکی ساردی زستاندا، دووکەس پێکەوە بەرێگایەکدا دەڕۆیشتن، یەکەمیان چەرخ و شقارتەی هەبوو، دووەمیشیان مێوژی پێبوو.

ساردی و سەرمای شەوەکە زیادی کرد، بۆیە کەسی یەکەم شقارتەکەی بەکارهێناو ئاگری کردەوەو داوای لەبرادەرەکەشی کرد، با ئەویش لەبەر ئاگرەکە خۆی گەرم بکاتەوە، بەمەرجێک بەشێکی لەو مێوژە بداتێ کە هەڵی گرتبوو، بەڵام کەسی دووەمی خاوەن مێوژ، مێوژەکەی هەر بۆخۆی دەویست و قایل نەبوو بەشی برادەرەکەی لێ بدات، بۆیە لەئاگرەکە کشایەوەو دوورکەوتەوەو بەشداریی برادەرەکەی نەکرد.



بەیانی کە ڕۆژ بووەوە، کابرای خاوەن ئاگر زیندوو مابووەوەو کابرای خاوەن مێوژیش ڕەق بووبووەوەو مردبوو .

سەرچاوەکان:
١- فۆلکلۆری کوردی.
٢- الأمثال الشعبیە.
٣- العربي الصغیر: یۆلیۆ ٢٠٠٥



ئەم دەشت و دۆڵ و گردە
هەمووی نەوت و گۆگردە
گشتی هەر خێرو بێرە
بست بەبست خاکمان زێرە
کوردستان هەر ئاوابێ
هەردەم لەخۆشی دابێ

٨
ژمارە ١١١
تشرینی یەکەم
٢٠٠٥






# ئایا تۆ دایکی منی؟

ئا: لەئەدەبی کەنەدییەوە:
شەرمین عەبدوڵڵا ڕواندزی

دایکە چۆلەکەیەک لەهێلانەکەی نیشتبوو، لەبڕ هەستی بەجووڵانی هێلکەکە کرد، دایکەکە گوتی:

ئای.. ئای.. وا دیارە هێلکەکە خەریکە دەترووکێ، باشتر وایە بەر لەوەی دەربچێت بچم خۆراکی بۆ پەیدا بکەم تا بیخوات.

دایکەکە ڕۆیشت..



هێلکەکە لەشوێنی خۆی دەجووڵایەوە، پاشان شکاو بێچووە چۆلەکەیەکی لێ هاتە دەر.

بێچووە چۆلەکەکە گوتی: کوا دایکم؟

چاوی بەملاو بەولادا گێڕا، بەڵام دایکی نەبینی، گوتی: من خۆم دەچم بەدوایدا دەگەڕێم.

ڕۆیشت، زۆر دوور ڕۆیشت، هەرچەندە نەیدەتوانێ بفڕێت بەڵام دەیتوانێ بڕوات.

گەڕا.. گەڕا.. هەرچەندە نەیدەزانی ڕەنگی دایکی چۆنەو بەچی دەچێت..



بێچووە چۆلەکەکە پشیلەیەکی بینی، پێی گوت ئایا تۆ دایکمی؟

پشیلەکە سەیرێکی کرد، بەڵام هیچ وەڵامێکی نەدایەوەو ڕۆیشت.

ئەمجارە مریشکێکی بینی، پێی گوت: ئایا تۆ دایکمی؟

گوتی: نەء!

ئەمجارە سەگێکی بینی، گوتی : ئایا تۆ دایکمی.

سەگەکەش گوتی: نەخێر من دایکت نیم، من سەگم.

بێچووە چۆلەکەکە گوتی: باشە ، پشیلەکە دایکم نەبوو، مریشکەکە دایکم نەبوو، سەگەکەش دایکم نەبوو.. ئەی کوا دایکم؟!

هەر لەڕۆیشتن بەردەوام بوو تا گەیشتە (گا) یەک، لێی نزیک بووەوە، لێی پرسی: ئایا تۆ دایکمی؟

ئەویش گوتی: من چۆن دەبێ دایکی تۆ بم؟ من (گا)م!





بێچووە چۆلەکەکە لەبەردەم خۆیەوە قسەی دەکردو دەیگوت: ئایا دەبێ من دایکم هەبێت؟



پاشان هەر بەخۆی وەڵامی دەدایەوە: من دەزانم دایکم هەیە، هەر دەبێ بیدۆزمەوە.

دواتر ڕۆیشت تاگەیشتە کۆنە ئۆتۆمبیلێک، بەهەموو عەقڵی خۆی گوتی: دەبێ ئەمە دایکم بێت. پاشان هەر خۆی گوتی: نەخێر شتی وا نییە، ئەمە دایکم نییە!



بەردەوام بوو لەڕۆیشتن، تا نزیکی دەریایەک بووەوە، سەیری کرد پاپۆڕێکی بینی، گوتی: هێ ی.. ئەمە دایکمە!

بانگی پاپۆڕەکەی کرد، بەڵام نەوەستاو ڕۆیشت.



هەر بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن، ئەمجارەیان دەنگی فڕۆکەیەکی گەورەی بیست، سەری بەرز کردەوەو گوتی: ئەمەیان دایکمە، بەڵام فڕۆکەکەش نەوەستاو ڕۆیشت.

بێچووە چۆلەکەکە زۆر بەخەمبارییەوە لەسەر بەردێک وەستا، ئەو جارە شتێکی گەورەی بینی نەیزانی چییە، بەڵام ئۆتۆمبیل بەرزکەرەوە(ڕافیعە) بوو، گوتی:



هێ.. هێ .. ئەمەیان دایکمە!

بەڕاکردن چووە سەری، ڕاوەستاو گوتی: دایە.. دایە.. ئەوە منم لێرە،

کە ئۆتۆمبیل بەرزکەرەوەکە دەستی بەکارکرد، چۆلەکەکە لەدەنگە گەورەکەی ترسا!

گوتی دەبێ لێرە نەمێنم، بەڵام نەیتوانی بێتە خوارەوە.

ئۆتۆمبیلەکە ڕۆیشت، ئەویش هەر لەسەری بوو، هاواری کرد: ئەوە بۆ کوێ دەچیت و چیم لێ دەکەی؟ بمهێنە خوارەوە، من دەمەوێ بچمەوە ماڵی خۆم و دایکم ببینم.

ئۆتۆمبیلەکە بیری کردەوەو بەرزی کردەوە بۆ سەرهێلانەی خۆی، لەوکاتەدا دایکەکە گەڕایەوەو خواردنێکی باشی بۆ هێنا بو.



پێی گوت: دەزانیت من کێم؟!

بێچووە چۆلەکەکەش گوتی:

بەڵێ من دەزانم ئێمە کێین، ئێمە پشیلە نین، مریشک نین، سەگ نین، گانین، پاپۆڕنین، فڕۆکەنین، ئۆتۆمبیلیش نین.. ئێمە باڵندەین و تۆش دایکی منی...

بەیەک شاد بوونەوە.



# لیژنەی خاچی سووری نێودەوڵەتی چۆن دامەزرا



و. لەعەرەبییەوە:
تاهیر عوسمان
نیگار: پەیام شاهین

لەحوزەیرانی ساڵی ١٨٥٩دا سەرمایەداری سویسری(هنری دۆنان) گەشتێکی بۆ باکووری ئیتاڵیا دەست پێکرد، تاکو بۆ گفتوگۆکردن لەبارەی هەندێک مەسەلەی بازرگانییەوە چاوی بەئیمپراتۆری فەرەنسایی(ناپلیۆنی سێیەم )بکەوێت، چونکە ئیمپراتۆر ئەوکاتە جەنگێکی گەورەی دژی نەمساییەکان بەرپاکردبوو.

دۆنان هەرکەلەدەوروبەری ئەو شارۆچکەیە نزیک کەوتەوە کە ئیمپراتۆری تێدا نیشتەجێ بووبوو، هەستی بەسەرسوڕمان و ترسێکی گەورە کرد، چونکە گۆڕەپانی جەنگەکە هەزاران کوژراوو برینداری لێ کەوتبوو، کە بەدەست ئازار دەتلانەوەو کەس نەبوو فریایان بکەوێ و یارمەتییان بدات و مردووەکان بنێژێ.

دۆنان هەوڵیدا فریای هەندێکیان بکەوێت، بەڵام کە لەناو زامدارەکاندا دەگەڕاو لەنزیکەوە کارەساتەکەی بەچاوی خۆی دەبینی، زیاتر تووشی حەپەسان دەبوو، چونکە فریاکەوتنی ئەو هەموو کەسە بەتەنیا کەسێک نەدەکرا، بۆیە دەمودەست ڕوو لەشارۆچکەکە دەکات و ئافرەتەکان بۆ برینپێچی و پیاوەکانیش بۆ فریاگوزاری کۆدەکاتەوەو هەموو لایەک بەچالاکییەوە دەست بەکاردەکەن.

دوای کۆتایی هاتنی جەنگەکەش بیرەوەرییە تاڵەکان لەیادی(دۆنان) نەچوونەوە، بۆیە لەساڵی ١٨٧٣دا لەگەڵ چەند پسپۆڕو سەرمایەدارێکدا کۆبووەوەو بیرۆکەی دامەزراندنی ڕێکخراوێکی نێو دەوڵەتیی فریاکەوتنی زامدارانیان دارشت.

لەساڵی ١٨٧٤یشدا یەکەم ڕێککەوتننامەی پارێزگاریی زامدارانی جەنگ بەناوی ڕێکخراوی(لیژنەی نێو دەوڵەتیی خاچی سوور) مۆرکرا، کە بارەگاکەی لەشاری (جنێف)ە، پێچەوانەکردنەوەی ئاڵای وڵاتی سویسراش بوو بە دروشمی ڕێکخراوەکە، واتە ڕەنگی خاچەکە کرایە سوورو دەورو بەریشی کرایە سپی. لەم ڕۆژەوەش ئەم ڕێکخراوە لەجەنگ و کارەساتە سروشتییەکانی وەکو بوومەلەرزەو لافاوەکان فریای لێقەوماوان دەکەوێت و کۆمەک و یارمەتییان پێشکەش دەکات.

سەرچاوە: مجلة(سندباد) العدد(١٥) ٢٠٠٣ ص ١١.








سارە فەتاح یەکێکە لەو بەهرەمەندە بەتەمەن بچووکانەی کە توانیویەتی بەو کەم تەمەنییەوە زۆر کاری نایاب و جوان ئەنجام بدات، سارە تەمەنی شازدە ساڵ و نیو دەبێت، بەڵام بێژەرێکی سەرکەوتووی دنیای گەورانەو لەگۆرانی گوتنیشدا دەنگێکی ناسک و بەجۆشی هەیە.

ئێمە لەگۆڤاری(هەنگ)دا بەچەند پرسیارێک سارەمان دواند:

**پ١: سارەکێیە؟**

و: سارە ئەو کەسەیە لەمنداڵییەوە دەستی بەکاری گەوران کرد.

**پ٢: لەکەیەوە خولیای کاری بێژەریت؟**

و: زۆر بچووک بووم حەزم لەکاری بێژەری بوو، ئەوە بۆماوەی دوو ساڵیش دەبێت بێژەرم لەدەنگی هەرێمی کوردستان.

**پ٣: بێژەری منداڵان دەبێ چۆن بێت؟**

و: بێژەری منداڵان دەبێ خولیای دنیای منداڵان بێت و ئەو کارانەی دەیکات لەگەڵ منداڵاندا بگونجێت.

**پ٤: کێ هاندەرتە بۆکاری بێژەری؟**

و: لەماڵەوە خوشکەکانم، لەدەرەوەش هاوڕێکانم.

**پ٥: جگە لەکاری بێژەری چیتر؟**

و: جگە لەکاری بێژەری لەدوو چالاکیی منداڵاندا لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیریی منداڵاندا بەشداریم کردووە، لەیەکەم فیستیڤاڵی منداڵان و ئاهەنگی ئەمساڵی ڕۆژی جیهانیی منداڵان، هەروەها لەدرامای (چۆلەکەی پەرژینەکە) دا دەوری سەرەکیم بینی، کە درامایەکی ڕادیۆیی بوو، پێکهاتبوو لە(٢٠٦) ئەڵقەو لەدەنگی حکوومەتی هەرێم هاتە پەخش و تۆمارکردن، ئێستاش سەرقاڵم بەخولی کۆمپیوتەر.

**پ٦: دەڵێن سارە دەنگی خۆشە، چۆنەگۆرانی ناڵێیت؟**

و: وەکو حەز زۆر حەزم لێیە گۆرانی بڵێم. بەڵام چونکە لەخوێندن بەردەوامم و بێژەری ڕۆژانەشم، بۆیە بیرم لێی نەکردووەتەوە.

**پ٧: بەکام بێژەر سەرسامیت؟**

و: لەمنداڵان بەسۆماو سیڤان، لەگەورانیش بەشاهۆ ئەمین.





# ئەو پیاوەی پارەکەیان لێ دزی

و.لەئینگلیزییەوە: جەزا حەمەلاو
نیگار: مریەم عەبدوڵڵا



پیاوێک بەسواری ئەسپێکەوە کە دوو جانتای پارەی لێ بارکرابوو، خۆی کرد بەناو شارۆچکەیەکدا. ئەو پیاوە پاش ئەوەی شەوی بەسەردا هات، ڕووی کردە میوانخانەی شارۆچکەکە.

پیاوەکە لەوە دەترسا کەسێک پارەکەی لێ بدزێت، بۆیە لەخاوەنی میوانخانەکەی پرسی: پارەکەم لەکوێ بشارمەوە تا دز پێی نەزانن؟

خاوەنی میوانخانەکەش گوتی: لەپشت میوانخانەکەوە بیرێک هەیە وشکی کردووە، بڕۆ لەناو ئەو بیرەدا بیشارەوە، !کەس پێی نازانێت.

پیاوەکە بەقسەی خاوەن میوانخانەکەی کردو چوو پارەکەی لەناو بیرەکەدا شاردەوە، پاشان هاتەوە بۆ میوانخانەکەو خەوت، بەڵام لەنیوەشەودا خاوەنی میوانخانەکە بەدزە دزە خۆی لە بیرەکە نزیک کردەوە، پاشان چووە ناو بیرەکەو پارەکەی دەرهێناو بردی.

بۆ بەیانی پیاوەکە پاش ئەوەی لەخەو هەستا، چوو بۆ سەر بیرەکەو بینی پارەکەی دزراوە، بەمە بۆی ئاشکرا بوو کە خاوەنی میوانخانەکە فێڵی لێ کردووە، بەڵام ئەو پیاوە زۆر زیرەک و دانابوو، بۆیە بیری لە پلانێک کردەوە تا پارەکەی دەست بکەوێتەوە.

پاش ئەوەی گەڕایەوە بۆ میوانخانەکە، وا خۆی دەرخست کە پارەکەی نەدزراوە، پاشان ڕووی کردە خاوەنی میوانخانەکەو گوتی : من ئەمڕۆ دەچمە بازاڕی ئەم شارۆچکەیەو پاش ئەوەی پارەیەکی زۆرم دەست دەکەوێت دەگەڕێمەوە ، ئایا ئەو پارەیەی کە دەستم دەکەوێت هەر لەهەمان شوێندا بیشارمەوە؟

خاوەنی میوانخانەکە لەبەر ئەوەی زۆر چاوچنۆک بوو و دەیویست ئەو پارەیەی کە پیاوەکە لەبازاڕ دەستی دەکەوێت ئەویش بدزێت، بۆیە گوتی : بەڵێ هەر لەهەمان شوێندا بیشارەوە، بیرەکە جێگایەکی زۆر باشە.







پاش ئەوەی پیاوەکە بەرەو بازاڕی شارەکە کەوتە ڕێ، خاوەنی میوانخانەکە هەردوو جانتا پارەکەی بردەوە ناو بیرەکە، تا لەگەڵ پارە تازەکە هەمووی پێکەوە بدزێت.

ئێوارە پیاوەکە گەڕایەوە، یەکسەر چووە سەر بیرەکەو پارەکەی دەرهێناو بێ ئەوەی خواحافیزی لەخاوەن میوانخانەکە بکات، شارۆچکەکەی بەجێ هێشت.

بەم شێوەیە پیاوەکە بەزیرەکیی خۆی پلانی خاوەن میوانخانەکەی پووچەڵ کردەوە، کەدەیویست پارەکەی لێ بدزێت.

سەرچاوە: One- Minute Bedtime Stories by shari lewis

# کۆلەکەی هەرقەل

ئا: خالید سابیر- سلێمانی

لەدەربەندی (جەبەل تاریق) کەهەردوو کیشوەری ئەوروپا و ئەفریقای لێک جیاکردووەتەوەو بووەتە هۆی بەیەکلکاندنی هەردوو دەریای سپیی ناوەندو ئۆقیانووسی ئەتلەسی، دوو بەردی گەورەی چەماوە هەن کەلەدێرزەمانەوە پێیان دەگوت (کۆڵەکەی هەرقەل).

ئەو دوو بەردە گەورەیە، بەبەشەکەی ئەوروپا دەڵێن (کالبی) و بە بەشەکەی ئەفریقاش دەڵێن (ئەبیلا).

گریک (یۆنان)ە کان لەکۆنداً وایان لێک دەدایەوە کە (هەرقەل)ی پاڵەوانی وڵاتەکەیان لەکاتی داگیرکردنی ئەو ناوچەیەدا ئەو دەربەندەی کردووەتەوەو لەو سەردەمانەدا ئەو شوێنەیان بەکۆتایی زەوی دەزانی.

دوای چەندین سەدە ئەو شوێنە بەردەوام ببووە گۆڕەپانی جەنگی سەربازی و لەهەمان کاتیشدا ببووە شوێنێکی گرنگی ئابووری و ئێستاش هەر ڕێگەیەکی گەورەی بازرگانییە.

سەرچاوە: أین توجد رحلة حول العالم، تونس ١٩٨٢

# بەزەردەخەنە ڕاهاتووین

هۆنراوەی: هاشم خۆرانی
نیگار: دارا محەمەد عەلی

تازە پێدەگەین منداڵین
ورشەی ئەستێرەی سامانڵین
بای شەماڵین...
منداڵی ژیکەڵەو وردین
لەنەوەی ئارین و کوردین
دەستوبردین
لەو کاتەی بۆ ژیان هاتووین
بەزەردەخەنە ڕاهاتووین
هەر لەسەرپشتی لانکۆڵە
بەپس پسۆکەی دایکۆڵە
گوتی : ڕۆڵە...
ژیان پڕ خەندەو ئەڤینە
پڕ خەونی هیوای شیرینە
پێ هەڵێنە...
بۆیە ئێستاکەش گەشبینین
تیشکی سەر ئاسۆی ڕەنگینین
مژدە دێنین...
ڕێبواری ڕێی خۆشەویستین
پەپوولەی گوڵی بەهەشتین
وا لەگەشتین
ژیانمان پڕ هیواو ڕازە
سروودو بەستەو ئاوازە
دڵخوازە
گوڵی پشکووتووی یەک چڵین
بەیەک دەست و بەیەک دڵین
دەست لەملین
سڵ ناکەین لەڕێی تێکۆشان
بۆ ئازادی و خۆشیی ژیان
بۆ کوردستان



# ئەتاری

هۆنراوەی: شکۆ
نیگار: مریەم عەبدوڵڵا





بابە، تامەزرۆی یاریی(ئەتاری)ن
پشووی هاوینە، بێ ئیش و کارین
لەماڵدا بێ دەنگ، یاریی جوان دەکەین
دڵ و دەروونمان شادمان دەکەین
ئیتر ناچینە کۆڵان بۆ وازی
بێزارین لەشەڕ، لەجنێوبازی
یاریی ئەتاری دەمانبزوێنێ
توانای بیرمان وەبەرهەم دێنێ
(سیدی)ی ئەتاریش چەندەها جۆرە
ئەوەیان بکرە کە سوودی زۆرە
توخوا بابە گیان، زوو بۆمان بێنە
پشووی هاوینە دڵمان مەشکێنە
بەڵێنیش دەدەین بێ شەڕ بەنۆرە
یاریی پێ بکەین لەهەرچی جۆرە
کاتی یاریشمان دوو کاتژمێربێ
قەت نایکەینە خوو، حەزمان پیێ فێربێ
هەربژی زانست بۆ داهێنانی
بۆم دنیا جوانەی بەرهەمی هانی

* ئەم هۆنراودیە دەبووایە لەپشووی هاویندا بڵاوبکرێتەوە، بەڵام بەهۆی درەنگ گەیشتن و چەند هۆیەکی دیکەی هونەرییەوە کەمێک دوا کەوت.

# کەروێشکێکی زیرەک




سیناریۆ: هەورین ئەحمەد
نیگار: هیوا عەبدولعەزیز
و. لەعەرەبییەوە:
چیمەن کاوێس


















سەرچاوە الأرنب الذكي: دمشق ١٩٩٨.

# لووت (کەپوو)

ئا: ڕەمزی میرەکانی
نیگار: پەخشان گەڵاڵی






لووت ئامرازی بۆنکردنە، کە سەرەتا بۆنەکە لەهەردوو کونی لووت کۆدەبێتەوە، پاشان بەرەو ڕێڕەوی لووت دەچێت، بۆ پارچەیەکی چڵمی بۆنکردن کە ڕووبەرەکەی لەپوولێکی پۆستە ڕەت ناکات.

ئەم ڕووبەرە، کە(٣) سم چوار گۆشەیە،(٢٠٠) ملیۆن خانەی تایبەت لەخۆوە دەگرێت، بەهۆی شفرەی ناسینی تایبەت بەخۆی و خانەکانی گەیاندن، بۆنەکان دەگرێت و دەیبات بۆ مێشک و لەوێ بۆنەکان دەزانرێن: بۆنی خۆش، ناخۆش، زۆرگران..

ئاژەڵ توانای بۆنکردنی لە مرۆڤ زیاترە ، مرۆڤ پێویستی بە(٥٠٠) ملیۆن ناوکەخانە هەیە لەیەک مەتری شەش پاڵوودا بۆ ئەوەی هەست بە بۆنێک بکات، بەڵام سەگ تەنیا پێویستی بە(٢٠٠) هەزار هەیە و سەگ دەتوانێت (١٠٠) هەزار بۆن لێک جیابکاتەوە، کەچی مرۆڤ دەتوانێت (٣) هەزار بۆن لەیەکتر جیابکاتەوە.

سەرچاوە: گۆڤاری(کل الناس) ژمارە ٣٣٥ لە ١٥/١٠/١٩٩٩.



# ئاهەنگێکی قەشەنگ بۆ منداڵان



بەبۆنەی کۆتایی هاتنی خولەکانی هاوینەو کردنەوەی دەرگای قوتابخانەکان، چالاکیی قوتابخانەکانی بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی ناوەند ئاهەنگێکی قەشەنگی بۆ منداڵە بەشداربووەکان سازکرد، کەتێیدا زارۆکە بەشداربووەکان بە بەرهەمی جوانیان توانییان ئاهەنگەکە ڕازاوەتر بکەن و بە دابەشکردنی خەڵات و دیاری کۆتایی بەئاهەنگەکە هات.

گۆڤاری(هەنگ) لەئاهەنگەکەدا ئامادەبوو و چەند منداڵێکی دواند:

* سەرەتا ماستڕۆی تیپەکە دەستە خوشکتان(جەنە محەمەد) گوتی: من یەکەم ساڵمە بەشداریی لەخولی مۆسیقادا دەکەم، بەڵام دیارە مامۆستاکان منیان بەدڵ بوو، بۆیە هەڵیانبژاردم بەسەرپەرشتیاری ئاهەنگەکە. من ئامێری (ئۆرگ) دەژەنم.

* ئالان موحسین منداڵێکی ژیرەو وتاری قوتابییانی بەشداربووی خولەکەی خوێندەوە، گوتی : هەست بەخۆشییەکی زۆر دەکەم کە وتاری قوتابییانم خوێندەوەو میوانان گوێیان لێ گرتم و چەپڵەیان بۆ لێدام.

من وەک پەیامنێر لە(هێلانەی منداڵان)دا ئیشم کردووە، ئێستاش ئامێری (ئۆرگ) دەژەنم.

* بەفر عەبدولڕەحمان لەسەر ئامێری کەمان بەگۆرانیی ڕۆژەکانی حەفتە ئاهەنگەکەی ڕازاوەتر کرد، گوتی: شانازی و سەر بەرزییەکی زۆرە بۆمن کە لەم خولەدا بەشداربووم و گۆرانیم گوت و مۆسیقام ژەند.



* ئەحمەد جەمال لەسەر ئامێری(برامس) گوتی: لەژیانمدا هەستم بەخۆشییەکی وا نەکردووە، کە تیپێکی ئاوا خنجیلانە بەشدارییان لەم ئاهەنگەدا کرد.

* شەیما ئازاد ئەندامی تیپ و کلارنێت ژەن گوتی: جێگای خۆشحاڵییە، چونکە یەکەم کچم ئامێری(کلارنێت) دەژەنم، حەزیش دەکەم ببم بەژەنیارێکی باش بۆ خزمەتی گەلەکەم. من وەرزشوانم و لە تایکواندۆ بەشداریم کردووە، لە هەموو یارییەکانی قوتابخانەش بەشداریم کردووە.





# سێ لە بەناوبانگترین هونەرمەندانی جیهان

ئا: ڕۆژا عوسمان دەشتی

١- لیۆناردۆ دافنشی: هونەرمەندێکی ئیتالییە، لەساڵی ١٤٥٢ی زایینی لە شاری فلۆرەنسا لەدایک بووەو لەساڵی ١٥١٩ کۆچی دوایی کردووە.

لەبواری توێکاری و ئەندازەو ئەدەب و مۆسیقاو پەیکەرتاشی و وێنەکێشاندا کارامە بووە، لەوێنەکێشاندا ناوبانگی دەرکردووە.

مۆنالیزا(جۆکۆندا) و مۆمی سووتاو لەبەناوبانگترین تابلۆکانی هونەرمەندن.

٢- مایکل ئەنگلۆ: ئەو هونەرمەندە ساڵی ١٤٧٥ی زایینی لەشاری(توسکان)ی ئیتاڵیادا هاتووەتە دنیاو ساڵی ١٥٦٤ کۆچی دوایی کردووە.

وێنەکێش و پەیکەرتاش وئەندازیارو شاعیربووە. نموونەی کارە هونەرییە ناودارەکانی دروستکردنی پەیکەری (مووسا) پێغەمبەر و داتاشین و هەڵکۆڵینی گومەزی کەنیسەی(قدیس پترۆس)ە لەڕۆمای پایتەختی ئیتاڵیا.

٣- ڤان کوخ: هونەرمەندی هۆڵەندی لەساڵی ١٨٥٣ی زایینی لەدایک بووە، بەڵام لەفەڕەنسا ژیاوەو لەساڵی ١٨٩٠ کۆچی دوایی کردووە.

لەوێنەکێشانی سروشتیدا دەستێکی باڵای هەبووەو یەکێک بووە لەڕابەرەکانی (قوتابخانەی دەربڕین).



* دواجار مامۆستای وانەبێژ (کارزان کەمال) گوتی: چالاکیی قوتابخانەکانی ناوەند بۆ ئەمساڵیش دووخولی بۆ ژمارەیەکی زۆر لەقوتابییانی سەرەتایی و ناوەندی کردەوە،بەباشیشمان زانی خولێکیش بۆ ئەندامانی تیپی چالاکی بکەینەوە، خولەکە بۆ ڕاهێنانی ئەندامانی تیپ بوو لەسەر نۆتەی مۆسیقا، چونکە پێشتر قوتابییان نەیاندەتوانی نۆتەی مۆسیقا بخوێننەوە.

ئا: ئاسوودە عەبدوڵڵا زادە
پەیامنێری گۆڤاری هەنگ





ئا: لەفۆلکلۆرەوە:
قەیسەر عەبدوڵڵا محەمەد
نیگار: هەژار سەڵاح



# مریشك و مام حەیدەر



مریشکێک لەگوندێکدا چەند هێلکەیەکی کردو لەسەریان کورک بوو، پاش ماوەیەک چەند جووجەڵەیەکی هەڵهێنا.

مریشکە بەقرتە قرت جووجەڵەکانی بەدووی خۆی دان و چووە ناو گژووگیا بۆ ئەوەی خواردن پەیدا بکات، لەناکاو ڕێوییەکی برسیی لێ پەیدابوو، پێی گوت:



– ئەوە چۆن لەم ئاقارەدا بەسەربەستی دەسووڕێیتەوە، دیارە ناترسیت؟

مریشکی بەستە زمان بەهەناسە ساردییەوە وەڵامی دایەوە:

– جووجەڵەکانم زۆر بچووکن و دوو ڕۆژە لەهێلکە ترووکاون، برسییەتیت ناشکێنن و تێرت ناکەن، با گەورەبن ئینجا وەرەوە.

بەهەر حاڵ ڕێوی بۆ ئەم جارە دڵی سارد بووەوەو ڕۆیشت، مریشکی داماویش بەپەلە جووجەڵەکانی گرد کردنەوەو بەرەو ماڵی مام حەیدەر کەوتنە ڕێ، کە گەیشتەجێ بەمام حەیدەری گوت:

– مام حەیدەر فریامان کەوە، ڕێوییەک خەریکە خۆم و جووجەڵەکانم دەخوات.

مام حەیدەر گوتی:

– بەسەرچاو، هەر ئەمڕۆ دێم چارەیەکت بۆ دەکەم.

ئینجا مام حەیدەر چوو نزیک کولانەی مریشکەکە حەشارگەیەکی دروست کرد، تاکو خۆی و تاژییەکانی تێدا حەشار بدات.

پاش دوو ڕۆژ ڕێوییەکە هاتەوە، بەهەڕەشەو گوڕەشەوە دەیگوت:

– ها مریشک، خۆ ئێستا بیانووت نەماوە؟

مریشکیش دەیزانی ئەمە دواجاریەتی بێت بۆ لای، بۆیە گوێی بە هەڕەشەو گوڕەشەکەی نەدا، بەڕێوی گوت:

– وەرە بەیەکەوە هەڵپەڕکێیەک بکەین، تاکو باشتر برسیت بێت، ئینجا دەست بکە بەخواردنەکەت.



ڕێوی و مریشک دەستیان بەهەڵپەرکێ کرد،
ڕێوی دەیگوت:

هەمریشکە مریشکە لانێ
سنگت بخۆم لەگەڵ ڕانێ

مریشکیش گوتی:

مام حەیدەر هات لەهەردا
توولەو تاژی لەگەڵدا

ڕێوییەکە تووڕە بوو، بەمریشکی گوت:
– پیرەژن، تۆ نازانی گۆرانی بڵێیت! ئینجا گوتی:

هەمریشکە بۆر بەڵەکە
جووجکانت خۆم گەڵەکە

ئینجا مریکیش هاواری کرد:

مام حەیدەری شاوری
بگرن ڕێوییێ غەزری

ئینجا تاژییەکان بەتاو لەحەشارگەکە هاتنە دەرەوەو هێرشیان بردە سەر ڕێوییەکەو گرتیان. مام حەیدەریش هات پەتێکی لەملی ڕێوییەکە کردو ڕۆیشت.

بەمجۆرە مریشک و جووجەڵەکان لەدەست ڕێوییەکە ڕزگاریان بوو.





# کتێبخانەی (هەنگ)

(گەشتی فریشتەکان) پێنجەمین کتێبی چاپکراوی مامۆستا (عەلی بەختەوەر)ی شاعیرە کە بەم زووانە لەهەولێر لەچاپخانەی (هاوسەر) بەچاپی گەیاندووەو دانەیەکیشی پێشکەش بەکتێبخانەی (هەنگ) کردووە.




ئێمە لەکاتێکدا سوپاسی شاعیر دەکەین هیواداریین هەر بەردەوام بێت و ئێوەی پەپوولەش بەگەرمی پێشوازی لەم کۆمەڵە (هۆنراوەو چیرۆکە) بکەن.

# بەرهەمی ئازیزان

٢٢

ژمارە ١١

تشرینی یەکەم

٢٠٠٥








* ریحاب نوسامە ئەحمەد
پۆلی پێنجەمی سەرەتایی
قوتابخانەی (بابا تاهیری هەمەدانی)
هەولێر






* ئاشتی کەریم سۆفی
پۆلی دووەم
قوتابخانەی (میدیا)ی نموونەیی
هەولێر





* سۆناتا سەلام جەعفەر
میدیای نموونەیی
پۆلی (KC2)



* بالا قاسم محەمەد
پۆلی یەکەمی سەرەتایی
قوتابخانەی (بیتوتێن)ی نموونەیی/ هەولێر



* باران حەسەن حوسێن
پۆلی چوارەمی سەرەتایی
قوتابخانەی شەهید حەسەن نەجار/ هەولێر

٢٣
ژمارە ...
تشرینی یەکەم
٢٠٠٥



# بەرهەمی ئازیزان



* هێما کەرەم عەبدوڵلا
تەمەن/ ٦ساڵ





* نوور ئوسامە ئەحمەد
تەمەن/ ٥ ساڵ



## بەهار

هۆنراوەی: سیتاڤ هیوا
قوتابی ناوەندیی کچان: کۆیە

وا بەهار گەڕایەوە
گژوگیا بووژایەوە
هەڵدەفڕن پەپوولەکان
لەسەر لقی گوڵەکان
ئێمەی منداڵ بەجوانی
دەیکەین بەزم و گۆرانی
دەیکەین بەشایی و ئاهەنگ
بۆ بەهاری ڕەنگاو ڕەنگ
لەبەر دەکەین جلی جوان
دەچین بۆ گەشت و سەیران
بەهار مانای خۆشییە
سروشت جوانیی پۆشییە



* نوا قاسم محەمەد
تەمەن/ ٧ ساڵ

* سیتاڤ خان بەو وەرزی پایزە ئەم هۆنراوە بەهارییەی بۆناردووین بەهیواین هەموو وەرزێکی بەهارو خۆشی بێت.

(هەنگ)

## وشەی بزر

ئامادەکردنی: پشتیوان کەریم شارەزا

دوای کوژاندنەوەی پیتەکانی ئەم ناوانەی خوارەوە لەناو خانەکانی خشتەکەدا(٤) پیت دەمێننەوە، چۆن دەتوانی ناوی ئەو ئامێرە باریک و درێژ و خۆشەویستەمان بۆ پێک بینی کەهەموو شتێکی پێ دەنووسین.

گۆڤار، دەفتەر، ڕۆژنامە،پەڕتووک، کاغەز

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| ە | و | و | ت | پ | ع | پێ |
| خ | ا | ا | ا | ڤ | ۆ | گۆ |
| ە | ر | ە | ت | ە | ە | ک |
| | ز | ە | غ | ا | ك | م |

## مەتەڵ

ئا: لائیقە سەلاحەدین

ئەمە چییە؟:

١- بێ ئەوەی قسە بکات شتمان فێر دەکات؟

٢- لاقی نییە غار دەدات، باڵی نییە هێلکە دەکات؟ مار

شیکارەکە لەلاپەڕەیەکی دی بدۆزەوە.

## وێنە ڕەنگکردن

ئا: مەهاباد خەلیل

ئەم وێنەیە
وەکو وێنە
ڕەنگاوڕەنگەکە
ڕەنگ بکە:



## بۆ زانین

ئا: ئالاز موحسین خالیدی

وشتر مورغ (نەعامە) گەورەترین باڵندەیە و باڵای لەدوو مەتر زیاترەو قورسایی بەقەد قورسایی جوانوویەکە.

نەعامە ئەگەر لەمەترسیدا بێت دەتوانێت بەخێرایی(٧٢) کیلۆمەتر لەیەک کاتژمێردا ڕابکات، واتە لەئەسپی کێبڕکێ خێراترە.

سەرچاوە: چراهای شگفت انگیز برندگان.








## دابەشکردنی زەوی

ئا: تارا

چوار برا خاوەن ئەم پارچە زەوییەن کە بریتییە لە چوار ماڵ و چوار بیر.

ئایا ئەندازیارێک چۆن دەتوانێت ئەم ڕووبەرە لەنێوانیاندا دابەش بکات بەمەرجێک هەر برایەک پارچە زەوییەک و ماڵێک و بیرێکی بەربکەوێت؟



شیکارەکە لەلاپەڕەیەکی دی بدۆزەوە.

## ئەم هۆنراوانە هی کام شاعیرن؟

ئا: چرا

١- کوردستان جێگای بەچکە شێرانە
جێگای هەوارگەی کوردو گۆرانە
خوایە هەرخۆش بێ ، بۆمان تاسەربێ
پاشماوەی خاکی مادو بابانە
(قانیع ،هاوار، کوردی، مەلای جزیری)

٢- ئەی کوردینە ، ئەی مەردینە
بادەست لەناو دەست کەین هەموو
بۆ بەرزیتی خاکی وەتەن
بۆیەکیتی بچین هەموو
کوردین هەموو
(زێوەر، کاکەی فەللاح، پیرەمێرد، دڵدار)

٣- خوایە وەتەن ئاواکەی
چەند دڵگیرو شیرینە
دەشتی خۆش و ڕەنگینە
ئاوی کەوسەرە
خاکی گەوهەرە
پڕ لەگوڵ و نەسرینە
(گۆران، بێخەو، هەردی، بێکەس)

شیکارەکە لەلاپەڕەیەکی دی بدۆزەوە.

## ئاهەنگی بووک گواستنەوە

نووسینی: یاسر مەعن
و. لەعەرەبییەوە/ هۆزان

خۆشحاڵین بە بانگهێشت کردنتان بۆ ئاهەنگی بووک گواستنەوەی (جگەر)ی کوڕم و کچی مامی (گەدە) لەمیوانخانەی(پەنکریاس) لەشەقامی(ڕیخۆڵە کوێرە) بەرانبەر(ڕیخۆڵە باریکەکان) لە کۆمەڵگای(ڕیخۆڵە ئەستوورەکان).

لەم ئاهەنگەدا میر(دڵ) و ئەندامانی خێزانەکەی(گوێچکۆڵەی ڕاست) و(سکۆڵەی چەپ) ئامادە دەبن و(خڕۆکە سوورەکان) بەخۆڕایی(خوێن) دابەش دەکەن. هەروەها هەردوو گۆرانیبێژی بەناوبانگ(زمان) و (قورگ)یش ئامادە دەبن.

تێبینی/ تکایە ئەو کەسانە لەگەڵ خۆتان مەهێنن کە(ددانی شیری)یان هەیە.. پیرۆزەو... و سوپاس

سەرچاوە: مجلتي - العدد ٢٦ السنة العشرون ١٩٨٩/٦/٢٦ ص٣٤.




ژمارە ١١١
تشرینی یەکەم
٢٠٠٥

## بۆ پێکەنین



ئا: عەبدوڵلا عومەر حەمید

١- دادوەرێک بەدزێک دەڵێت: پۆلیس دەڵێن تۆ دووجار دزیت لەکۆگایەکی جلوبەرگ کردووە.
دزەکە: بەڵێ ڕاستە.
دادوەر: بۆ؟
دز: چونکە جاری یەکەم کراسێکم بۆ کچەکەم دزی، بەڵام بەدڵی نەبوو، جاری دووەم گەڕامەوە بیگۆڕم!
٢- وەستایەک بەشاگردەکەی دەڵێت: ئەرێ تۆ ماندوو نابیت ئەوەندە دادەنیشی؟
شاگرد: بەڵێ ماندوو دەبم.
وەستا : باشە ، پاش ئەوەی لەدانیشتن ماندوو دەبیت چی دەکەی؟
شاگرد: دادەنیشم و دەحەسێمەوە.

## شیکاری لاپەڕەکان

شیکاری مەتەڵ: ١- کتێب. ٢- مار.
شیکاری وشە بزر: خامە
شیکاری ئەم هۆنراوە:
هاوار، زیوەر، بێکەس



شیکاری دابەشکردنی زەوی



## ڕێگا دۆزینەوە

ئا: مەهتاب سەلاحەدین



ڕێگایەک بدۆزەوە بۆ ئەم مشکە تا بە پەنیرو سەموونەکە بگات بۆ ئەوەی سکە برسییەکەی پێ تێر بکات.

# ئەلبوومی هەنگ



شانۆ ئیبراهیم حوسێن



مینا هەڤاڵ بەرزنجی



پەروا هەڤاڵ بەرزنجی



سانا عەبدوڵڵا



ژیکاڵ عەدنان عەبدولقادر



پەپوولە فەلاح



ژیار موحسین عەلی



شکار موحسین عەلی



ڕێچین ـ دڵڤین نەجات حوسێن



بروا ناسیح موحسین



ڕەبیان عەدنان سابیر



مستەفا حیسامەدین جەودەت



مونیب حیسامەدین جەودەت



عەلی پشتیوان مەجید



محەمەد ـ زهرە عیسا



ئاڵا عەدنان سابیر



محەمەد یادگار



شیلان سەردار











# پشیلەو تووتی

و. لەعەرەبییەوە: ڤیان شێرکۆ
نیگار: دڵشاد عەلی



















نرخی (١٣٠٠) دینار